# | زادی ئیماندار له ژیاندا

و: دانا شافیعی | گزنگ

لەم بیابانە وشەکدا، تەنها زادێك مرۆڤی ئیماندار هەیبێ دڵنیا بوونییەتی بە وەعد وپەیمانی خوای پەروەردگار، ئەو بەڵێنی سەرکەوتن وتەمکینەی خوای پەروەردگار بە بەندەکانی خۆی داوە: {وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ} - خوای پەروەردگار بەڵێنی داوەتە باوەڕدار وخاوەن کردارە چاکەکانتان، وەك چۆن ئەوانی پێشیانی لە زەویدا جێنشین کرد ئەوانیش جێنشین کات وئەو دینەیان بۆ بچەسپێنێ کە لێی ڕازییەو بۆیانی هەڵبژاردووە، ئەو ترس ولەرزەیان بۆ بکاتە هێمنی وئاسایش وئارامی، بەو مەرجەی بمپەرستن وهیچ هاوەڵ وهاوبەشێکم بۆ قەرار نەدەن، جا گەر کەسێ لە دوای ئەوەدا کوفری کرد وبێ باوەڕی کرد، بە ڕاستی ئەوانە کەسانی دەرچوو ولە ڕێ لادەرن .

بێ گومان بەڵێنی خوای پەروەردگار ڕاستەو ناگۆڕێ، لە ڕۆژی خۆشیدا بە خاوەنەکانی ئەگات وئەیانگرێتەوە .

بۆیە مرۆڤی باوەڕدار ئەگەر دڵنیاش نەبوو ئاخۆ بەڵێنەکەی رب العالمین ئەو ئەگرێتەوە یان نا، بەڵام دڵنیایەو یەقینی هەیە خەڵکانێکی بڕوادار لە دوای ئەودا دێن وشامیلی ئەو بەڵێن

وپەیمان وچارەنووسە ئەبن .. ئەویش یا ئەوەتا شەهیدی بە دەست دێنێ، یاخود چاوەڕوانی سەرکەوتن وسەرفرازییە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت؛ **{مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا}** - بڕوادارن پیاوانێکیان تیایە، لەو بەڵێنەدا ڕاستگۆ بوون کە بە پەروەردگاریان دابوو، ئیتر بڕێکیان لەسەر ئەو پەیمان وبەڵێنەیان بە پەروەردگاریان گەیشتنەوەو وبڕێکیان وا چاوەڕێن، هەرگیز ئەو پەیمان وبەڵێنەشیان نەگۆڕی ولایان نەدا .

ئەو باوەڕدارانەی لە بەڵێنی خوای پەروەردگاریان دڵنیان؛ دەستیان بۆ ئەوە ناچێ دەستکاری شتێکی دینی خوای پەروەردگار بکەن تاوەکو لەتکەیەکی دونیا وبەرژەوەندییەکی خەیاڵ کراو بە دەست بێنن، یا بەرژەوەندییەك کە لە هاوکێشەی دینی خوای پەروەردگاردا هیچ جێگەو مەکانەتێکی نییە .

دڵنەوایی باوەڕدار بە بەڵێنی خوای پەروەردگار؛ ئەو هاندەرەیە کە بەرەو هەر کارێکی چاك هەیە بەڕێی ئەکات، ئەو هاندەرەیە کە ئارامی وتوانای ئەوەی پێ ئەدا بەرگەی ناخۆشی وناڕەحەتی بگرێ، تا ئەو کاتەی گزنگی ڕاستگۆی بەرەبایان ئەبینێت وجیهانی ڕووناك ئەبێتەوە .

بەڵێ دروستە جیهان نوقمی شەڕ وخراپە بووە، گومڕا ونادروستەکان گەیشتوونەتە ئەو پەڕی بەرزی وتواناییان، تەنها ئەوانن کە دەنگیان لە هەموو شوێنێکدا دەبیسترێ؛ لە ڕۆژنامەو گۆڤار وکەرەستەی بیسراو وبینراودا .. بەڵام هەموو ئەمە ئامرازی تاقیکردنەوەو ئیبتیلایە، بۆ ئەوەی خەڵك ناوەڕۆکی شتەکانیان بۆ دەرکەوێت وڕووی دروستی ئەو مەردمە ببینن .

بەڵێ، ئەمڕۆ ڕۆژی خراپەو لووتبەرزی گومڕایی وسەرکردایەتی نادروستان ودەنگی قسەی نەفامانە .. بەڵێ ئەمە ڕۆژ وسەردەمی خۆیانە .

بەڵام لە هەمان کاتدا ڕۆژی بڕوادارانە دڵنیایی ودۆستایەتی خۆیان بۆ خوای پەروەردگار بەدەربێخن، خۆیان وخەڵك ببینن کە چەندە پەیوەندییان بە خوای پەروەردگار بەهێزە، چەند ئارەزوو وویستی خوای پەروەردگاریان هەیە وچەندە تامەزرۆی بەهەشتەکەین .

ئەمە ئەو ڕۆژگارەیە بەندە ڕاستگۆکان هەلی خۆیانی تێدا ببیننەوە بچنە ژێر سێبەری قەولی خوای پەروەردگار؛ **{وَقَلِيلٌ مَا هُمْ}** - ئەوان [بڕواداران وخاوەن کرداری چاك] بەڕاستی کەم ودەگمەنن .. یا بچنە ژێر سێبەری؛ **{وَثُلَّةٌ مِنَ الْآخِرِينَ}** - ئەوان [دەستەی ڕاست وئەهلی ڕاستەڕێ] کۆمەڵ وپۆلێکی زۆری ئەو خەڵکانەن کە لە دواییدا دێن .. هەلێکە بۆ ئەوەی یەکێك بێ لە "پێشکەوتووەکان" یا "دەستەو کۆمەڵی دەستە ڕاستەکان ."

موسوڵمانان .. بەندەکانی خوا؛

ئەم هەلە زێڕینە لە دەست خۆتان مەدەن .. خۆتان لەو بەخششە خواوەندییە بەرزانە ون مەکەن .. هەمووی هەر چەند ساتێك وسەبری سەعاتێکە؛ پاشان بە دیداری پەروەردگارمان ئەگەینەوە .

خوایە؛ یارمەتی بەندەکانت بدەو کاری چاکیان بۆ ئاسان کە، پەنا بە نووری ڕووی تۆ ئەگرین لەوەی گومڕامان کەیت وتووشی فیتنەمان کەیت .. خۆت ئەزانی کە ئارەزووی وەجهـ وڕووی تۆمانە .. اللهم آمین .

---

سەرچاوە:- گۆڤاری ئەنصار | ژ١٤٨ / پێنجشەممە: ٢١ ذو الحجة ١٤١٦ کۆچی

پێگەی ئیسلامی گزنگ
Facebook :- @Gizing.net
Telegram :- @GizingNet

